


# بەرنامەی وۆرد ٩٧



## فێربوونێکی ئاسان بە ماوەیەکی کەم






ئامادەکردنی : ئاراس حاجی مەولود

التفسير

٢٠٠٢

مەبەست لە زنجیرەی زانستەکانی کۆمپیوتەر:

١- ئاشناکردنی خەڵکی کوردستان وەك گەلانی تری پێشکەوتووی دنیا بە زانست و بواری جیاجیای کۆمپیوتەر و بەکارهێنانی بۆ خزمەتی ئاین و گەل و نیشتمان.

٢- ئاسانکاریی و زەمینەسازی بۆ تاکی خوێندەواری کۆمەڵگەی کوردی بە مەبەستی فێربوونی کردەیی کۆمپیوتەر و سیستەمەکانی.

٣- بەهرەمەند بوون لە بەخشش و سودە جیاجیاکانی بواری کۆمپیوتەر و بەکارخستنی لەبەرەوپێش بردنی کۆمەڵگەدا.

٤- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی و خزمەتکردن بەزمانی کوردی لەم بوارەدا.

فۆرسینگی ئەفسیر

# بەرنامەی

# وۆرد ٩٧

نوژادس

## فێربوونێکی ئاسان بە ماوەیەکی کەم

ئامادەکردنی: ئاراس حاجی مەولود

لە بڵاوکراوەکانی نوسینگەی تەفسیر / هەولێر

نـــــاوی کتێـــــب: بەرنامەی وۆرد ٩٧

ئامادەکـــــــردنی: ئاراس حاجی مەولود

کۆمپـــــــــیوتەر: مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس/ هەولێر

تایتـــــلی بـــــەرگ: نەوزاد کۆیی

چاپ و بڵاوکردنەوەی: نووسینگەی تەفسیر/ هەولێر

ژمـــارەو ســاڵی چـــاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٢

چــــــــاپکردن: چاپخانەی نـــازە

تـــــــــــیراژ: ٢٠٠٠ دانە

ژمـــارەی ســـپاردن: ٤٠١ ساڵی ٢٠٠٢

التفسير
هەولێر - شەقامی دادگا
ت: ٢٢٢١٦٩٥-٢٢٣٠٩٠٨
tafseeroffice@maktoob.com
AlTafseer@hotmail.com

# پــێــشکــەش

- پـێشکـەشـە بـە دایـك و بـاوكـی زۆر زۆر خـۆشـەویستم .
- پـێشـكـەشــە بــە هــەمــوو دۆســت و بــرادەرانــم .
- پـێشکـەشە بـە هـەمـوو زانست خـوازێكی كـورد و جیهـانی .
- پێشكەشە بە گیانی ئـەو زانست خوازانەی كە شەونخونیان كـردووە بـۆ بـە جێ گـەیـانـدنـی سـوود بـە میللەتەكەمان .
- پـێشەكـەشە بـە هـەمـوو ئـەو كـەسانەی هـاندەرم بوون .
- پێشــكەشـــــە بە نوســـینگەی ( تەفســـیر )ی بەرێـــز.

ئاراس حاجی مەولود

# پـێـشـەكـى

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ﴾

**سەرەتا خوێنەری خۆشەویست پێش هەموو شتێك بە پێویستی دەزانم كە زۆر زۆر سوپاس و ستایشی خودای گەورە بكەم كە بە چاكەی خودا و فەزلی ئەو من ئەم جارەش توانیم وەكو جاری پێشوو خزمەتێك بە خوێنەرانی خۆشەویست بگەیێنم كە دوای ئەوەی كتێبەكەی پێشووم ( ویندۆس ٩٨ ) بەرهەم هێنا و توانیم بیگەیێنمە بەر دیدی خوێنەران ، ئەم جارەش بە باشم زانی ئەم كتێبە ( بەرنامەی ووٚرد ٩٧ ) بە بەرهەم بێنم، بە هاوكاری نوسینگەی ( تەفسیر )ی بەڕێز بتوانم بیگەیێنم بە خوێنەرانی خۆشەویست و بلاوی بكەمەوە تا هەموو ئەو هاولاتیە خۆشەویستانەی بە دوای زانستی كۆمپیوتەر دا دەگەڕێن بتوانن سوود لەم بەرهەمانە ببینن. داواكارم لە خودای گەورە و میهرەبان توانام پێ ببەخشێ تا بتوانم خزمەتی زیاتر بگەیەنم بە هەموو كەسێكی زانست خواز و ڕۆشنبیر.. لێرەوە بە باشی دەزانم كە خوێنەران لەوە تێ بگەیێنم كە ئەم كتێبە یارمەتی دەرێكی زۆر باشە بۆ ( دەست پێ كەران و پێشكەوتوان و پێگەیشتوان ) لەم بوارەی بەرنامەكە هەنگاوەكانی ئەم كتێبەش زۆر شتی لە خۆ گرتووە هەر وەك هەمیشە چۆن بڕیارمان دا بوو ئەم كتێبانە بە شێوەی زنجیرە بگەیێنینە بەر دیدی خوێنەران. ئاواش داواكارم لە خودای گەورە كە یارمەتی دەرم بێت. لە خوێنەرانی خۆشەویست وەك هاندەرێك هانم بدەن بۆ تەواو كردنی ئەو چەند بەشەی كە ماوە لەبارەی ( بەرنامە زەرورەكانی تری كۆمپیوتەر )، ئیتر هیوادارم بەم هەنگاوە سودێكم بە ئێوەی خۆشەویست گەیاندبێ، و ئەگەر كەم و كوڕیەكی هەبوو ئەوە هیوادارم كە لێم ببورن .**

**ئاراس حاجی مەولود**

**مەلبەندی كۆمپیوتەری ئاراس**

# پێرست

# ناسینی شریتی بەشەكان

بۆ ناسینی ئەو شریتانەیە كە لە ناو ڕوبەری لاپەڕەكەدا هەن و كاریان پێ دەكەین.

Microsoft Word - word books 97 Aras

ئەم شریتە ناسراوە بە شریتی ( ناونیشان )

ملف تحرير عرض إدراج تنسيق أدوات جدول إطار تعليمات

ئەم شریتە ناسراوە بە شریتی ( لیستەكان )

130%

ئەم شریتە ناسراوە بە شریتی ( قیاسی )

Traditional Arabic 12 B I U

ئەم شریتە ناسراوە بە شریتی ( تنسیق )

رسم أشكال تلقائية

ئەم شریتە ناسراوە بە شریتی ( رسم )

# وانـــەی یەکەم

١- ســـەرەتـــای چـــوونە نـــاو بەرنامەی وۆرد .

٢- چۆنێتی هێنانی لاپەڕەیەك بۆ ناو بەرنامەکە .

٣- چـــۆنێتی ئـــامـــادە کردنی لاپـــەڕەکـــە .

٤- چـــاو پێداخشـــانەوەیەك پێش چاپ کردن .

٥- چـــۆنـێـتی چـــاپ کـــردنی لاپـــەڕە .

٦- چـــۆنـێـتی پـــاراســـــتنی لاپـــەڕە .

٧- چـــۆنێتی کردنەوەی لاپەڕەیەکی پـــارێزراو .

٨- چـــۆنێتی داخســـتنی بەرنامەکە ، لاپەڕەکە.

# ١- سەرەتای چوونە ناو بەرنامەی ووٚرد

بۆ چوونە ناو بەرنامەی وۆرد، دەتوانین بە دوو ڕێگا بچینە ناو بەرنامەی وۆرد .

١- سەرەتا دەچینە سەر My Computer ، ئنجا دەچینە سەر بەشە هـاردی C:/ ، لەوێشـەوە دەچینە سەر Program file ، لەوێشەوە دەچـینە سـەر Microsoft Office ، ئنجا Microsoft Word ، ئنجا بەرنامەی ووٚرد بە دەبڵ کلیکی لای چەپ دەکەینەوە .

٢- هـەروەها بۆ کردنەوەی بەرنامەی ووٚرد دەتوانین لە ڕێگای لیستی Start وە بچینە سەر هەڵبژاردەی Program ، لەوێشەوە بچینە سەر Microsoft Word و بە یەك جار کلیکی لای چەپ بیکەینەوە .

# ٢- چۆنیەتی هێنانی لاپەڕەیەك بۆ ناو بەرنامەكە

بۆ هێنانی لاپەڕەیەكی تازە بۆ ناو بەرنامەی وۆرد سێ ڕێگامان هەیە:

١-لە ناو بەرنامەی وۆرد دەچینە سەر لیستی (ملف)، لەوێ دەچینە سەر (جدید) ، یەك جار كلیكی لای چەپی لە سەر دەكەین شێوەیەكمان بۆ دەردەچێ كە لەو شێوەیە دا (مستند فارغ) هەڵدەبژێرین و كلیكی لە سەر دەكەین .

٢- هەر لە ناو بەرنامەی وۆرد و لە سەر شریتی (قیاسی) كە دەكەوێتە بەشی سەرەوەی لاپەڕەكە و ژێرەوەی شریتی لیستەكان، دەچینە سەر ئەم شێوەیە كە شێوەی پەڕەیەكی سپی یە ، یەك جار كلیكی لە سەر دەكەین، دەبینین كە یەكسەر لاپەڕەیەكمان بۆ دێنێتە ناو بەرنامەكەوە بێ دەركەوتنی هیچ شێوەیەك .

٣- هەروەها دەتوانین بە كیبۆرد لاپەڕەیەكی تازە بێنین بۆ ناو بەرنامەی وۆرد كە ئەویش بە هۆی كلیلی Ctrl + N ، كە ئەو دوو كلیلە پێكەوە دابگرین لاپەڕەیەكمان بۆ دەردەكەوێ بێ دەركەوتنی هیچ شێوەیەك .

# ٣- چۆنیتی ئامادە کردنی لاپەڕەکە

چـۆنێتی ئامـادە کـردنی لاپەڕەیـەك لـە نـاو بەرنامـەی وۆرد بـەم شێوەیە دەبێت :

سـەرەتا ئەگـەر ویسـتمان لـە هەر چوار لای لا پەڕەکە بۆشایی بەجێ بهـێڵین ئەوە دەتوانین بچینە سەر لیستی ( ملف ) ، لەوێش بچینە سەر ( أعـداد الصـفحة ) و لەوێ یەك جار کلیکی لای چەپ دەکەین، دەبینین کـە شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت ،لەو شێوەیەدا دەچینە سەر ( هوامش )، لـەوێ دەتوانـین قـەبارەی بۆشایی بۆ دەوروبەری لا پەڕەکە دابنێن بە هۆی ئەو چوار بۆشایەی کە لەوێ هەیە .

هـەروەها دەتوانـین لـە بەشی (( حجم الورق )) کە دەکەوێتە تەنیشت ( هوامـش ) ،کـە لەوێشـدا دەتوانـین قەبارەی لا پەڕەکە دابنێین بەو شـێوەیەی کـە خۆمـان مەبەسـتمانە بـە هۆی ئەو دوو بۆشایییەی کە لەوێدا هەیە .

# ٤- چاو پێداخشانەوەیەك پێش چاپ كردن

لە پێش چاپكردنی لاپەڕەیەك لە ناو بەرنامەی وۆرد وا بە باش دەزانین هەموو كات پێش ئەوەی لاپەڕەكە چاپ بكەین ، چاوێكی پێدا بخشێنینەوە . بۆ چاوپێداخشانەوە لە پێش چاپ كردن دوو ڕێگامان هەیە .

١-سەرەتا دەچینە سەر لیستی ( ملف ) لەناو بەرنامەی وۆرد ئنجا لەوێشەوە دەچینە سەر ( معاينة قبل الطباعة ) ، لەوێ یەك جار كلیكی لای چەپی لە سەر دەكەین، جا شێوەی لاپەڕەكەمان بە گشتی بۆ دەردەكەوێ لە ناو بەرنامەكە.. چۆن لاپەڕەكە ببینی لە كاتی ( معاينة )دا، ئەوە بەو شێوەیە لاپەڕەكەت لە سەر وەرەقە بۆ چاپ دەكات، واتا چاو پێداخشانەوەكە نمونەیەكت پێ نیشان دەدات كە ئەو نمونەیە شێوەی ئەو وەرەقەیە یە كە تۆ بە نیازی چاپی بكەیت. بۆ چوونە دەرەوەش لە ( معاينة قبل الطباعة ) دەچینە سەر ( أغلاق ) لە شریتی ( معاينة ) دا.

٢- هەروەها دەتوانین كاری ( معاينة قبل الطباعة ) لە سەر شریتی ( قياسی ) ئەنجام بدەین كە ئەویش بە هۆی ئەم شێوەیەوە یەك جار كلیكی لای چەپی لە سەر دەكەین بۆ ئەنجام دانی چاوپێداخشانەوەكە .

# ٥- چۆنێتی چاپ كردنی لاپەڕە

بۆ چاپ كردنی لاپەڕەكە لەناو بەرنامەی وۆرد دوو ڕێگامان هەیە:

١- سەرەتا دەچینە سەر شریتی ( قیاسی ) و لەوێوە دەچینە سەر شێوەی ئامێری چاپ كردن ( طابعة ) كە ئەمە شێوەكەیەتی ، لەوێش یەك جار كلیكی لای چەپی لە سەر دەكەین بۆ چاپ كردنی نووسینەكانمان بێ دەركەوتنی هیچ شێوەیەك .

٢- سەرەتا لە ناو بەرنامەی وۆرد دەچینە سەر لیستی ( ملف ) ، لەوێوە دەچینە سەر ( طباعة ) ، یەك جار كلیكی لای چەپی لە سەر دەكەین ، شێوەیەكمان بۆ دەردەچێت ، لەو شێوەیەدا دەچینە سەر زانیاریەكانی چاپ كردن كە بە ئارەزووی خۆمان زانیاری پێ دەدەین بۆ چاپ كردنی نووسینەكانمان . دوای پێدانی زانیاریەكان كلیك دەكەین لە سەر ( موافق ) بۆ ئەنجام دانی چاپكردنەكە.

٣- هەروەها دەتوانین ئەم كارە لە ڕێگای كیبۆردەكەوە ئەنجام بدەین، كە ئەویش بە داگرتنی ئەم دوو كلیلە بە یەكەوە Ctrl+P دەتوانین ئەم كارە ئەنجام بدەین .

# ٦- چۆنێتی پاراستنی لاپەڕە

بۆ پاراستنی لاپەڕەیەك لە ناو بەرنامەی وۆرد دوو ڕێگامان هەیە.

١- سەرەتا ئەگەر ویستمان لاپەڕەیەك بپارێزین و ( حفظی ) بکەین ئەوە دەتوانین لە ناو بەرنامەی وۆرد بچینە سەر لیستی ( ملف ) ، لەوێوە بچینە سەر ( حفظ ) یان ( حفظ بأسم ) ، لەوێ یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت ، لەو شێوەیەدا و لە بۆشایی ( حفظ في ) ئەو شوێنە هەڵدەبژێرین کە دەمانەوێ فایلەکەی تێدا بپارێزین ، لە بۆشایی ( أسم الملف )یشدا ناوێك بۆ فایلەکە دادەنێین و ئەو ناوە بە ئارەزووی خۆمان دەنووسین ئنجا کلیك دەکەین لە سەر ( حفظ ) بۆ پاراستنی لاپەڕەکە.

٢-هەروەها دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگای شریتی ( قیاسی )یەوە ئە نجام بدەین بەوەی کە لە سەر ئەم شێوەیە یەك جار کلیکی لای چەپ بکەین 💾 هەمان شێوەی پێشوومان بۆ دەردەچێت .

# ٧- چۆنیێتی کردنەوەی لاپەڕەیەکی پارێزراو

بۆ کردنەوەی هەر لاپەڕەیەکی پارێزراو لە ناو بەرنامەی وۆرد دەتوانین ئەم کارە بە دوو شێوە ئەنجام بدەین :

١-سەرەتا لە ڕێگای شریتی لیستەکانەوە دەچینە سەر لیستی ( ملف )، لەوێوە دەچینە سەر ( فتح ) و یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت ، لەو شێوەیەدا لە بۆشایی یەکەم کە بە ناوی ( بحث في )یە ئەو شوێنە هەڵدەبژێرین کە فایلەکەمان تێدا پاراستووە و ( حفظ ) کردووە. دوای دەرکەوتنی شوێنەکە دەچینە سەر ئەو فایلەی کە مەبەستی کردنەوەیمان هەیە و دیاری دەکەین ، ئنجا یەك جار کلیکی لای چەپ لە سەر ( فتح ) دەکەین بۆ کردنەوەی ئەو فایلە پارێزراوە .

٢- هەروەها دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگای شریتی ( قیاسی )یەوە ئە نجام بدەین کە ئەویش بە هۆی ئەم شێوەیەوە ▬ کە یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین هەمان شێوەکانی پێشوومان بۆ دەردەچێت، بە هەمان هەنگاوەکانی پێشوو لاپەڕەیەکی پارێزراو دەکەینەوە.

## ٨ - چۆنێتی داخستنی بەرنامەکە یان لاپەڕەکە

بۆ داخستنی هەر لاپەڕەیەك لە ناو بەرنامەی وۆرد دەتوانین بە چەند ڕێگایەك ئەو کارە ئەنجام بدەین ، هەروەها دەتوانین بۆ داخستنی بەرنامەکەش چەند ڕێگایەك بە کاربێنین :

١- سەرەتا دەتوانین لە ناو بەرنامەی وۆرد لاپەڕەکە بە هۆی نیشانەی X کە دەکەوێتە ڕیزی شریتی لیستەکان دا بخەین کە ئەویش بەهۆی یەك جار کلیکی لای چەپ دەبێت لە سەر شێوەکە .

٢- هەروەها دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگای کیبۆردەکەوە ئە نجام بدەین کە ئەویش بە هۆی ئەم دوو کلیلەوە Ctrl+w دەتوانین ئەم کارە ئە نجام بدەین بە داگرتنی ئەو دوو کلیلە بە یەکەوە .

١- بۆ داخستنی بەرنامەکەش دەتوانین لە سەر ئەم شێوەیە X بکەین کە ئەم شێوەیە دەکەوێتە سەر شریتی ناونیشان کە ئەویش یەك جار کلیکی لای چە پی لە سەر دەکەین بۆ داخستنی بەرنامەکە .

٢- هەروەها دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگای کیبۆردەکەوە ئە نجام بدەین کە ئەویش بە هۆی ئەم دوو کلیلەوە Alt+F4 دەتوانین ئەم کارە ئە نجام بدەین بە داگرتنی ئەو دوو کلیلە بە یەکەوە .

# وانـــەی دووەم

١- کـلیلـە گــر نگـەکـانی سەر کیـبۆرد .

٢- گـــەڕانـــەوە و دوو بـــارە دانـانـەوە .

٣- لە بەر گرتنەوە و بڕین و دانانی نووسینێک .

٤- چـۆنێتی دیـــاری کـردنی نـووسینێک .

٥- چـۆنێتی سڕیـنـە وەی نـــووسینێـک .

# ١- كـليله گرنگەكانى سەر كيبۆرد

بۆ باس كردنى كليله گرنگەكانى سەر كيبۆرد باسى ئەم چەند كليله دەكەين كە هەندێ كارى گرنگى پێ ئەنجام دەدرێت :

١- كليلى Back Space واتا سڕينەوەى نووسينەكان لە كۆتايى دێڕەكەوە .

٢- كليلى Enter واتا چوونە سەر دێڕێكى تازە لە ناو لاپەڕەكە.

٣- كليلـى Shift بەكارهێـنانەكانى ئەم كليلە جۆريان زۆرە، دەتوانين ئەم كلـيله لـە گەڵ ئەو هێمايانە بە كار بێنين كە لە سەر ژمارەكان نووسراوە بۆ دروست كردنى هێمايەكان ، هەروەها دەتوانين ئەم كليلە لە گەڵ كليلى Ctrl بۆ گۆڕينى ئاراستەى نووسينەكان لە عەرەبييەوە بۆ ئينگليزى بەكار بێنين .

٤-كليلى Ctrl بە كارهێنانى ئەم كليلە لە زۆر كاتدا لە گەڵ ووشەكان بەكار بێنين بۆ ئە نجام دانى ئەو فەرمانانەى كە لە ناو ليستەكان ئەم هێمايانەى تێدايە واتا كليلى Ctrl لە گەڵ ووشەكان بە كليلى فەرمانەكان ناسراوە .

٥- كلـيلى Delete واتا ئەم كليلە بۆ سڕينەوە بەكاردێ كە دەتوانين ئەگەر لە پێشەوەى دێر بوين ئەوە بە هۆى ئەم كليلەوە نووسينەكان بسڕينەوە .

٦- كليلى End واتا چوونە سـەر كـۆتـاى دێـر .

٧- كليلى Home واتا چوونە سـەر سەرەتـاى دێر .

٨- كليلى Page Up واتا چوونە سـەرەوەى لا پـەڕە .

٩- كليلى Page Down واتا چوونه ژێرەوەی لا پەرە .

١٠- كلــيلى Caps Lock : ئەم كليله تەنها بۆ نووسينى ئينگليزى بە كاردێ كـە ئـەويش ئەگـەر كلـيلەكە دابگـرين ئـەوە نووسينەكا نمان بۆ دەكات بە ووشەی گەورە .

١١- كلـيلى Tap : ئەم كليلەش دەتوانين بۆ هاتو چۆكردن لە ناو خشتەكان بـەكار ی بێـنين ، هـەروەها بـۆ جـێ هێشـتنى بۆشـاييەكى زۆر لـە بەينى نووسينەكان .

١٢- كلـيلى Esc : ئـەم كلـيلە لە زۆر كاتدا بۆ پەشيمان بوونەوە لە كارێك بەكار دێنين .

١٣- كلـيلى ئاڕاسـتەكان كـە هـەر يەك لەو شێوانەی كە ئاڕاستەكەی ديارى كراوە بەو ئاڕاستەيە دا ئەڕوات لە ناو نووسينەكاندا . ← ↕ →



# ٢- گەڕانەوە و دوو بارە دانانەوە

دوای ئەنجام دانی هەر کارێك لە ناو بەرنامەی وۆرد دەتوانی بە چەند شێوەیەك گەڕانەوە یان دووبارە دانانەوەی نووسینێك ئەنجام بدەین .

١-سەرەتا بۆ گەڕانەوە لە نووسینێك یان لە بەشێك دەتوانین بچینە سەر شریتی لیستەکان و لەوێ بچینە سەر لیستی ( تحرير ) ، لەوێ دەچینە سەر فەرمانی ( تراجع ) و یەك جار کلیکی لای چەپ دەکەین لە سەر فەرمانەکە بۆ ئە نجام دانی گەڕانەوەکە .

٢- هەروەها بۆ دووبارە دانانەوەی ئەو بەشەی کە لێی گەڕاینەوە دەتوانین بە هەمان شێوە بچینە سەر لیستی ( تحرير ) و لەوێ کلیك دەکەین لە سەر فەرمانی ( أعاده الكتابه ) بۆ دووبارە کردنەوەی ئەو بەشەی کە لێی گەڕاینەوە .

٣- هەروەها دەتوانین ئەم دوو کارە لە ڕێگای شریتی ( قیاسی )یەوە ئە نجام بدەین بە هۆی ئەم دوو شێوەیە ( ↶ ، ↷ ) ئەم شێوەیە ↶ بۆ گەڕانەوە وە ئەم شێوەیە ↷ بۆ دووبارە دانانەوە.

# ٣ - بڕین و لە بەر گرتنەوە و دانانی نووسینێك

بۆ بڕین و لەبەر گرتنەوە و دانانی نووسینێك لە ناو بەرنامەی وۆرد دەتوانین بە چەند شێوەیەك ئەم كارە ئەنجام بدەین :

١- بۆ بڕین سەرەتا لە ناو لاپەڕەكە ئەو نووسینەی كە دەمانەوێ بیبڕین دیاری دەكەین، ئنجا دەچینە سەر لیستی ( تحریر ) و لەوێوە دەچینە سەر ( قص ) و یەك جار كلیكی لای چە پی لەسەر دەكەین بۆ ئە نجام دانی بڕینەكە..

هەروەها دەتوانین ئەم كارە بە هۆی شریتی ( قیاسی ) یەوە بكەین بە هۆی ئەم شێوەیە ✂ كە دەتوانین دوای دیاری كردنی نووسینەكە یەك جار كلیكی لای چە پی لە سەر بكەین.

هەروەها دەتوانین ئەم كارە لە ڕێگای كیبۆردەكەوە ئە نجام بدەین بە هۆی كلیلی Ctrl + x كە ئەو دوو كلیلە بە یەكەوە دادەگرین دوای دیاری كردنی نووسینەكە .

٢-بـۆ لـە بەرگرتنەوەی نووسینێك سەرەتا دەتوانین لە ناو لاپەڕەكە ئەو نووسینەی كە دەمانەوێ لەبەری بگرینەوە دیاری دەكەین، دەچینە سـەر لیستی ( تحریر ) و لەوێوە دەچینە سەر ( نسخ ) ، یەك جار كلیكی لای چە پی لەسەر دەكەین بۆ ئە نجام دانی لەبەرگرتنەوەكە.

هـەروەها دەتوانـین ئەم كارە بە هۆی شریتی ( قیاسی )یەوە بكەین بە هـۆی ئـەم شـێوەی كـە دەتوانین دوای دیاری كردنی نووسینەكە یەك جار كلیكی لای چە پی لە سەر بكەین.

هـەروەها دەتوانین ئەم كارە لە ڕێگای كیبۆردەكەوە ئە نجام بدەین بە هـۆی كلـیلی Ctrl + C كـە دوای دیـاری كردنی نووسینەكە ئەو دوو كلیلە بە یەكەوە دادەگرین.

٤-بـۆ دانـانی نووسـینێك سـەرەتا لە ناو لاپەڕەكە دەچینە سەر ئەو شـوێنەی كـە دەمانـەوێ نووسـینەكەی لێ دابنێین، ئنجا دەچینە سەر لیسـتی ( تحریـر ) و لەوێوە دەچینە سەر ( لصق )، یەك جار كلیكی لای چە پی لەسەر دەكەین بۆ دانانی نووسینەكە.

هـەروەها دەتوانین ئەم كارە بە هۆی شریتی ( قیاسی )یەوە بكەین، كە دەچـینە سـەر شێوەی كە لە تەنیشت ( نسخ )دایە، دەتوانین یەك جار كلیكی لای چە پی لە سەر دەكەین بۆ دانانی نووسینەكە.

هـەروەها دەتوانین ئەم كارە لە ڕێگای كیبۆردەكەوە ئە نجام بدەین بە هـۆی كلـیلی Ctrl +V كـە ئەو دوو كلیلە بە یەكەوە دادەگرین دوای دەست نیشان كردنی جێی دانانەكە.

# ٤- چۆنێتی دیاری کردنی نووسینێك

بۆ دیاری کردنی هەر نووسینێك لە ناو بەرنامەی وۆرد دەتوانین بە چەند شێوەیەك ئەم کارە ئەنجام بدەین .

١- دە توانین ئەم کارە بە ماوسەکە ئە نجام بدەین، کە دەبێت ماوسەکە بەرینە سەر ئەو شوێنەی دەمانەوێ نووسینەکانی لێ دیاری بکەین ئنجا کلیکی لای چەپ دەکەین و ماوسەکە ڕادەکێشین بەو ئاراستەی کە خۆمان دەمانەوێت .

٢- هەروەها بۆ ئە نجام دانی دیاری کردنی گشتی نووسینەکان، دەتوانین لە ڕێگای شریتی لیستەکانەوە بچینە سەر لیستی ( تحرير ) و لەوێوە دەچینە سەر فەرمانی ( تحديد الكل ) ، بۆ ئە نجام دانی دیاری کردنەکە یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین.

Microsoft Word - Document2

گەر لە باخی جوتیاری هەژار
پاشیەک سێوێ بخاتە ناو زار
دەست و پێوەندی کە ئەوێیان دی
دارسێوەکی دەکەن سەرەوخوار

سەعدی شیرازی



# ٥- چـۆنیێتی سڕینەوەی نــووسینێك

بۆ سڕینەوەی هەر بەشێك یان هەر نووسینێك لە ناو بەرنامەی وۆرد دەتوانین چەند ڕێگایەك بە كاربێنین .

١- پێش ئـە نجام دانـی هـەر كـارێك لـە ناو بەرنامەی وۆرد دەبێت نووسـینەكان دیـاری بكـەین. ئـێمە لە بەشی ڕابردودا باسی چۆنێتی دیـاری كـردنی نووسـینەكا نمان كـرد ، ئـنجا دوای دیاری كردنی ئەو بەشـەی كـە دەمانـەوێ بیسـڕینەوە دەتوانـین بـە ڕێگـای شـریتی لیسـتەكانەوە بچینە سەر لیستی (( تحرير )) و لەوێشەوە بچینە سەر فـەرمانی (( مسح )) ، لەوێ یەك جار كلیكی لای چە پی لە سەر دەكەین بۆ ئە نجام دانی سڕینەوەكە .

٢- هـەروەها دەتوانین دوای دیاری كردنی نووسینەكان كاری سڕینەوە لە ڕێگای كیبۆردەوە بە هۆی كلیلی Delete ئە نجام بدەین .

# وانــەی سێ یــەم

١- چۆنێتی گەڕان بە دوای نووسینێك یان وشەیەك.

٢- چـۆنێتی گـۆڕینی نووسینێك یان وشەیەك.

٣- چـــۆنـێـتـی چـــوونـــە ســـەر لاپـــەڕە.

٤- چـــۆنـێـتـی ڕێـکـخـسـتـنی لاپـــەڕەکـان.

٥- چـۆنێتی دانان یان لابردنی شریتی بەشەکان.

٦- چـــۆنێـتی دانـــان یـــان لابـــردنـــی ڕاســتە.

# ١- چۆنێتی گەڕان بە دوای نووسینێك یان وشەیەك

بۆ گەڕان بە دوای نووسینێك یان ووشەیەك دەتوانین ئەم كارە بە چەند ڕێگایەك ئەنجام بدەین .

١- لە جیاتی ئەوەی كە ئێمە بە شێوەیەكی زەحمەت بە دوای نووسینێك یان ووشەیەك داله ناو نووسینێكی زۆر دا بگەڕین، لە ناو بەرنامەی ووِرد دەتوانین بە شێوەیەكی ئاسان ئەم كارە ئە نجام بدەین و، دەتوانین بە دوای نووسینێك یان ووشەیەك دا بگەڕێین.
بۆ ئە نجام دانی ئەم كارە لە ناو نووسینەكان دەچینە سەر لیستی ( تحرير ) و لەوێوە دەچینە سەر فەرمانی ( بحث )، یەك جار كلیكی لای [illegible] سەر دەكەین، دەبینین شێوەیەكمان بۆ دەردەچێت، لەو بۆشاییەكە ئەو ووشەیە دەنووسین كە دەمانەوێ بە دوای [illegible] كلیك لە سەر ( بحث عن التالي ) دەكەین بۆ ئە نجام [illegible]، دەبینین ئەو ووشەیەمان بۆ دەدۆزێتەوە كە ئێمە بە [illegible]

[illegible] نین ئەم كارە لە ڕێگای كیبۆردەكەوە ئە نجام بدەین كە ئەویش بە هۆی ئەم دوو كلیلەوە Ctrl+F دەتوانین ئەم كارە ئە نجام بدەین ئەویش بە داگرتنی ئەو دوو كلیلە بە یەكەوە .

او نووسینیکی زۆر لە ناو بەرنامەی وورد ئەم کارە ئەنجام

ە ئێمە بە شێوەیەکی زەحمەت ئەوە دەتوانین بە

نووسینێك یان ووشەیەك بگەڕێن بۆ ئەنجام دانی ئەم

چینە سەر لیستی (( تحرير )) وە لەوێوە دەچینە سەر

لای چەپی لە سەر دەکەین دەبینین

لەو شێوەیەدا لە بۆشایەکە ناوی ئەو ووشەیە دەنووسین

کە دەمانەوێ بە دوای دا بگەڕییچن ئنجا کلیك دەکەین لە سەر (( بحث عن التالي ))

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە دەبینین ئەو ووشەیەمان بۆ دەدۆزێتەوە کە ئێمە بە دوای

دا دەگەڕاین

٢- وە هەروەها دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگای کیبۆردەکەوە ئەنجام بدەین کە ئەویش



## ٢- چۆنیّتی گۆڕینی نووسینیّك یان وشەیەك

بۆ گۆڕینی نووسینیّك یان ووشەیەك لە ناو بەرنامەی وۆرد دا، لە ناو نووسینیّکی زۆر دا ئەگەر ووشەیەکی هەڵە هەبوو ئەوە دەتوانین بەچەند شیّوەیەکی ئاسان ئەو کارە ئەنجام بدەین:

١- لە جیاتی ئەوەی کە ئیّمە بە شیّوەیەکی زەحمەت نووسینیّك یان ووشەیەك لەناو نووسینیّکی زۆردا بگۆڕین، ئەوە دەتوانین لە ناو بەرنامەی وۆرد ئەم کارە ئە نجام بە شیّوەیەکی ئاسان بدەین و ئەو وشەیە یان نوسینە بگۆڕین،
بۆ ئە نجام دانی ئەم کارە لە ناو نووسینەکان دەچینە سەر لیستی ( تحریر ) و لەویّوە دەچینە سەر فەرمانی ( استبدال ) ، یەك جار کلیکی لای چە پی لە سەر دەکەین، دەبینین شیّوەیەکمان بۆ دەردەچیّت، لەو شیّوەیەدا دوو بۆشایی هەیە، لە ناو بۆشایی یەکەم ناوی ئەو ووشەیە دەنووسین کە هەڵەیە ، لە بۆشایی دووەم ناوی ووشە ڕاستەکە دەنووسین کە دەمانەوێ ووشە هەڵە کەمان بۆ بگۆڕی بە ووشە ڕاستەکە. ئنجا کلیك لە سەر ( استبدال ) دەکەین بۆ ئە نجام دانی تەنها یەك گۆڕانکاری، بەلاّم ئەگەر ووشە هەڵەکە لە چەند شویّنیّك دووبارە بوویووە وە، ئەوە کلیك لە سەر ( استبدال الکل ) دەکەین بۆ ئە نجام دانی گۆڕینی ووشە هەڵەکان بە گشتی .

٢- هەروەها دەتوانین ئەم کارە لە ڕیّگای کیبۆردەکەوە ئە نجام بدەین کە ئەویش بە هۆی ئەم دوو کلیلەوە C t r l +H ، دەتوانین بە داگرتنی ئەو دوو کلیلە بە یەکەوە ئەم کارە ئە نجام بدەین.

# ٣- چۆنێتی چوونە سەر لاپەڕە

بۆ چوونە سەر لاپەڕەیەك لە ناو بەرنامەی وۆرد دەتوانین لە ناو کۆمەڵێك لاپەڕەی زۆر بە چەند شێوەیەکی ئاسان بچینە سەر ئەو لاپەڕەیەی کە دەمانەوێ .

١- دەتوانین لە ناو نووسینێکی زۆردا ، بۆ نموونە ئەگەر (٣٠٠ ) لاپەڕە نووسینمان هەبوو، لە جیاتی ئەوەی کە ئێمە بە شێوەیەکی زەحمەت بچینە سەر لاپەڕەکان، ئەوە دەتوانین لە ناو ئەو هەموو لاپەڕە زۆرە بچینە سەر لیستی ( تحریر ) و لەوێشەوە دەچینە سەر (انتقال الی ) ، لەوێ یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت ، لەو شێوەیەدا یەك بۆشایی هەیە، لەو بۆشاییەدا ژمارەی ئەو لاپەڕەیە دەنووسین کە دەمانەوێ بچینە سەری ، ئنجا کلیك دەکەین لە سەر ( انتقال الی ) بۆ چوونە سەر لاپەڕەکە بە شێوەیەکی ئاسان .

٢- هەروەها دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگای کیبۆردەکەوە ئەنجام بدەین کە ئەویش بە هۆی ئەم دوو کلیلەوە Ctrl +G دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین ، بە داگرتنی ئەو دوو کلیلە بە یەکەوە .



Traditional Arabic
یتی چوونه سەر لاپەڕە
بەرنامەی وورد دەتوانین لە ناو کۆمەڵێك لاپەڕەی
پینە سەر ئەو لاپەڕەیەی کە دەمانەوێ .
لاپەڕەکان ئەوە دەتوانین لـە نـاو ئـەو هـەموو لاپـەڕە زۆرە بچینـە سـەر لیستی
(( تحریر )) وە لەوێشەوە دەچینە سەر (( انتقال الی )) وە لەوێ یەك جـار کلیکی
لای چەپی لە سەر دەکەین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت لەو شـێوەیەدا یـەك بۆشـایی
Microsoft Word




١- سەرەتا دەتوانین لـە نـاو نووسـینێکی زۆر بـۆ نموونـە ئەگـەر (٣٠٠ ) لاپـەڕە
نووسینمان هەبوو لە جیاتی ئەوەی کە ئێمە بە شـێوەیەکی زەحمـەت بچینـە سـەر
لاپەڕەکان ئەوە دەتوانین لـە نـاو ئـەو هـەموو لاپـەڕە زۆرە بچینـە سـەر لیستی
٢- وە هەروەها دەتوانین ئەم کـارە لـە ڕێگـای کیبۆردەکـەوە ئـە نجام بدەیـن کـە
Microsoft Word

# ٤ چــۆنیّتی ڕیّــکخستنی لاپـــەڕەکان

بۆ ڕیّکخسـتنی لاپـەڕەکان لـە نـاو بەرنامـەی وۆرد، دەتوانـین ئـەم کارە بە دوو ڕیّگا ئەنجام بدەین :

١- بـۆ ڕیّکخســتنی لاپـەڕەکان لـە نــاو بەرنامەی وۆرد دەچینە سەر لیسـتی ( عـرض ) ، لـەوێ ئـەم پیّنج فەرمانەمان هەیە بۆ ڕیّکخستنی لاپـەڕەکان : (( ١- عـادي ٢- تخطـیط فوری - ٣- تخطیط الصفحة ٤- مفصل ٥- المسـتند الرئیسـي ))، بـە هـۆی ئـەم پیّـنج فەرمانە دەتوانــین لاپەڕەکان هەر یەکی بە شیّوەیەك ڕیّك بخەین . لە نـاو ئەم پیّـنج فەرمانە دا بۆ ڕیّکخستنی لاپەڕەکان بە شیّوەیەکی بەردەوام لە سەر فەرمانی (( تخطیط الصفحة )) دەبیّت .

٢- هـەروەها دەتوانــین ئەم کارە لە ڕیّگای شریتی هاتوچۆ ئەنجام بدەیـن کـە ئەمـە شـیّوەکانیانە بـەوەی کە یەك جار کلـیکی لای چـەپ لــە سەر هەر یەك لەم شیّوانە بکەین. هەروەها لەم ڕیّگایەشــەوە دەبیّـت شیّوەی ڕیّکخستنەکە لە سەر ( تخطیط الصفحة ) بیّت چونکە ئەم بەشە لە هەموو بەشەکانی تـر ڕیّکترە .

# ٥- چۆنێتی دانان یان لابردنی شریتی بەشەکان

بۆ دانان یان لابردنی شریتی بەشەکان لە ناو بەرنامەی وۆرد دەتوانین ئەم هەنگاوانە بە کار بێنین .

سەرەتا ئەگەر یەکێك لە ئەو سێ شریتەی کە بە بەردەوامی لە ناو بەرنامەی وۆرد هەیە، لەناو بەرنامەکە نەبون، کە بۆ ئەنجام دانی هەندێك لە کار و فەرمانەکانی ناو بەرنامەکە پێویستمان پێیان دەبێ، بۆ هێنانەوەیان دەچینە سەر شریتی لیستەکان و لەوێوە دەچینە سەر لیستی ( عرض )، لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی ( أشرطة الأدوات )، ئنجا بە هۆی یەك جار کلیکی لای چەپەوە شریتی ( قیاسی ) دیاری دەکەین، دەبینین کە ئەو شریتە دەگەڕێتەوە شوێنی تایبەتی خۆی لە ژێر شریتی لیستەکانەوە.. هەروەها بۆ دانانەوەی ئەو دوو شریتەی دیکەش ( تنسیق ) و ( رسم )، هەمان ئەو هەنگاوانەی پێشوو ئەنجام دەدەین بۆ دانانەوەی هەر سێ شریتە گرنگەکانی ناو بەرنامەکە... هەروەها بۆ لابردنی ئەو شریتانە دەتوانین بە هەمان شێوە بچینە سەر شریتی لیستەکان و لەوێوە بچینە سەر فەرمانی ( أشرطة الأدوات )، لەوێ بە پێچەوانەی ئەوەی پێشوو، هەڵدەستین بە لابردنی نیشانەی ڕاست (   ) لە سەر فەرمانی شریتەکان بە هۆی یەك جار کلیکی لای چەپی ماوسەکەوە .

تێبینی : سێ شریتی گرنگ هەیە لە ناو بەرنامەی وۆرد کە ئەوانیش: ١- قیاسی ٢- تنسیق ٣- رسم

# ٦- چــۆنیێتی دانــان یان لا بــردنی ڕاسته

بۆ دانان یان لابردنی شریتی ڕاسته له ناو بەرنامەی وۆرد، که بەکارهێنانی (ڕاسته) له ناو بەرنامەی وۆرد به یەکێك له کاره گرنگەکان دەژمێردرێت ، دەتوانین ئەم هەنگاوانە بە کار بێنین :

**ئەگــەر ویستمان شریتی ( ڕاسته ) به بەردەوامی له ناو بەرنامەی وۆرد هــەبێ ئەوە دەتوانین بۆ ئه نجام دانی هەندێك له کار و فەرمانەکانی ناو بەرنامەکه به کاری بێنین وەکو کاری قیاس کردنی هەر بەشێك که بمانەوێت لــه ناو بەرنامەکه به کاری بێنین .. بۆ دانان یان لابردنی شریتی ڕاسته له ناو ئەم بەرنامەیه دەبێت سەرەتا بچینه سەر شریتی لیستەکان و لــەوێوە دەچینه سەر لیستی ( عرض ) ، لەوێشەوە دیسان دەچــینه سەر فەرمانی ( المسطرة ) ، لەوێشەوە به هۆی یەك جار کلیکی لای چــه پەوە شــریتی ( ڕاســته ) دیــاری دەکــەین، دەبیــنین کــه ئــەو شریتەمان له سەر ڕوبەری لا پەڕەی بەرنامەکه بۆ دەردەکەوێ..**

**ئەگەر ویستمان ئەو شریته له ناو لا پەڕەی بەرنامەکه لا بدەین، ئەوه دەتوانــین هــەمان کارەکــانی پێشــوو ئــه نجام بدەین تا دەگەینه ناو لیســتی ( عرض ) و لەوێوە ئەو دیاری کردنەی که له سەر شریتی ڕاسته دا هەیــه ئەوە دیاری کردنەکه لادەدەین ، دەبینین که ڕوبەری لا پەڕەی بەرنامەکه دەگەڕێتەوە بۆ دۆخی جارانی خۆی، بەلاّم له هەموو کات وا بــه باشی دەزانین که ئەو شریته له سەر ڕووبەری لا پەڕەی بەرنامەکه بوونی هەبێت .**

# وانـــەی چـوارەم

١- چـۆنێتی دانــانی ژمـارە بـۆ لا پـەڕەکـان.

٢- چـۆنێتی دانانی کات یان بەروار بۆ لا پەڕکان.

٣- چـۆنێتی هێنانــی شێـوەیـەکـی تــایبەتی.

٤- چۆنێتی دانانی سەرچاوەی نووسین بۆ لاپەڕەکان.

٥- چــۆنێتی هێنانــی وێـنە بـۆ نـاو لاپـەڕەکــان.

٦- چۆنێتی هێنانی شێوەیەك بە ماوس رێك دەخرێت.

# ١- چـۆنیێتی دانـانی ژمـاره بـۆ لا پەڕەکان

بۆ دانانی ژماره بۆ لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد، دەتوانین ئەم کاره بەم شێوەیه ئەنجام بدەین، که دەکرێ لە پێش ئەوەی نووسین بنوسین یان لە دوای نووسینەکه ژمارەکە لە ناو لاپەڕەی بەرنامەکه دابنێین .

سەرەتا دەبێت ئەگەر نووسینمان نه نووسی بوو بچینه سەر شریتی لیستەکان و، لەوێشەوه بچینه سەر لیستی ( أدراج )، ئنجا له لیستی ( ادراج )ـەوه دەچینه سەر فەرمانی ( أرقام الصفحات ) و یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین بۆ دەرکەوتنی شێوەیەك که لەو شێوەیەدا دەتوانین شوێنی ژمارەکەلە سەر لاپەڕەکه هەڵبژێرین، هەروەها لە ناو شێوەکەدا و لە بەشی ( تنسیق ) دەتوانین ئەوه هەڵبژێرین که له ژماره چەندەوه دەست پێ بکات، ئنجا دوای هەڵبژاردنی شوێنەکه و ژمارەکە یەك جار کلیکی لای چەپ له سەر فەرمانی ( موافق ) دەکەین بۆ دانانی ژمارەکه لەو شوێنەی که هەڵت بژاردوه له ناو لاپەڕەکەدا.. دوای دانانی ژمارەکه ئەگەر له لاپەڕە( ١ ) چووینه سەر لاپەڕە ( ٢ ) ئەوه پێویست ناکات دیسان بچیتەوه سەر هەمان کار، بەڵکو ئەو کاره خۆی به شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەو کارەمان بۆ ئەنجام دەدات، واتا خۆی ژمارەی لاپەڕە ٢ و لاپەڕە ٣ و لاپەڕە ٤ و ....... دەنووسێ تا ئەو شوێنەی که تۆ نووسینی لێ دەنووسی .

# ٢- چـۆنیێتی دانانـی کات یان بەروار بۆ لا پەڕکان

بۆ دانانی کات یان بەروار لە ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد، کە زۆر جار پێویستمان بەوە دەبێت، دەتوانین ئەم کارە بەم شێوەیە ئەنجام بدەین .

لـە نـاو لا پەڕەکـە دەسـت دەکـەین بـە نووسین، بۆ نموونە نامەیەك دەنووسـین، بۆیـە نووسینی نامە بە نموونە دێنمەوە چونکە لە هەموو کاتـێك کـە نامـە دەنووسـین کـات و بـەرواری نامەکـە لـە ژێرەوەی لا پەڕەکـە دەنووسـین.. ئـنجا دوای نووسـینی نامەکـە، لـە ژێرەوەی نامەکـە، لـەو شـوێنەی کـە خۆمان مەبەستمانە دەچینە سەر شریتی لیستەکان و لەوێوە دەچینە سەر لیستی ( أدراج ) و لەوێوە دەچینە سەر فـەرمانی ( التاریخ و الوقت ) کە ئەو بەشە تەنها تایبەتە بە دانانی کـات و بـەروار بۆ لا پەڕەکە، ئنجا یەك جار کلیکی لای چە پی لە سەر دەکـەین، دەبیـنین شـێوەیەکمان بـۆ دەردەچـێت لەو شێوەیەدا چەند هەڵـبژاردەیەکی تـێدایە کـە تایبەتن بە کات و بەرواری ئینگیزی ، عـەرەبی ، هجـری ، میلادی . هەر کام لەم هەڵبژاردانەمان بوێت ئەوە هەڵی دەبژێرین و یەك جار کلیکی لای چەپ لە سەر فەرمانی ( موافق ) دەکەین بۆ هێنانی کات و بەروارەکە بۆ ناو لا پەڕکە .

## ٣ - چـۆنێتی هێنانی شێـوەیەکی تایبەتی

بۆ هێنانی شێوەیەکی تایبەتی بۆ ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد و کار پێکردنی، دەتوانین بێجگە لەو شێوە تایبەتیانەی کە لە سەر کیبۆردەکە هەیە، هەندێ شێوەی تر کە لە ناو لیستەکاندا هەیە بە کاریان بێنین .

ئەگەر ویستمان شێوەیەکی تایبەتی بێنین بۆ ناو لاپەڕەیەکی بەرنامەکە، بۆ نموونە شێوەی ( تەلەفۆنێك ) ( ☎ )، یان شێوەی ( مەقەسێك ) ( ✂ )، یان شێوەی ( چاویلکەیەك ) ( 👓 )، یان شێوەی ( خانویەك ) ( 🏠 )، یان چەند شێوەیەکی تر کە بە کیبۆردەکە دروست نابێت، ئەوە دەتوانین لەو شوێنەی کە مەبەستمانە بچینە سەر شریتی لیستەکان و لەوێوە بچینە سەر لیستی ( أدراج ). ئنجا لە ناو لیستی ( ادراج ) بچینە سەر فەرمانی ( رمز )، ئنجا یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێ، کە لەو شێوەیەدا و لە بۆشایی شێوەکەدا دەتوانین هەر یەك لەو بابەتانە هەڵبژێرین، هەر یەك لەو بابەتانەش کۆمەڵێ شێوەی تایبەتی تێدایە. ئنجا دوای هەڵبژاردنی شێوە تایبەتیەکە دەچینە سەر فەرمانی ( أدراج ) و یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین بۆ هێنانی شێوە تایبەتیەکە بۆ ناو لاپەڕەی بەرنامەکە .

# ٤- چۆنیێتی دانانی سەرچاوەی نووسین بۆ لاپەڕەکان

بۆ دانانی سەرچاوەی نووسین بۆ لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد کە ئەم کارە بە کارە سەرەکیەکانی بەرنامەی وۆرد دەژمێردرێت. هەرچەندە ئەم بەشە تایبەتە بە نووسەری کتێب و بلاوکراوە، کە ئەو نووسەرە نووسینێك دەنووسی کە ئەو نووسینەی لە سەرچاوەیەکەوە وەرگرتووە، ئەوە ئەو سەرچاوەیە دەبێت لە ژێرەوەی لاپەڕەکە دیاری بکات، ئاماژەش بۆ ئەوە بکات کە ئەو نووسینە هی کام نووسەرە، ئنجا بۆ ئەنجام دانی ئەو کارە و دانانی سەرچاوەیەك بۆ نووسینەکان دەتوانن ئەم هەنگاوانە بە کار بێنن:

ئەگەر ویستمان نووسینێك بنووسین، ئامازەش بۆ ئەو خاوەن نووسینە و سەرچاوەی نووسینە بکەین، ئەوە دەبێت سەرەتا ئاراستەی ماوسەکە لەو شوێنەی دابنێین کە دەمانەوێ ژمارەی سەرچاوەکەی لێ دابنێین، ئنجا دەچینە سەر شریتی لیستەکان ، لەوێشەوە دەچینە سەر لیستی ( أدراج ) و لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی ( حواشي سفلية )، ئنجا یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین. دەبینین کە شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێ، لەو شێوەیەدا و لە بۆشایی ژمارەکان ئەو ژمارەیە دەنووسین کە دەمانەوێت، ئنجا یەك جار کلیکی لای چەپ لە سەر ( موافق ) دەکەین بۆ دانانی ژمارەکە لە پشت نووسینەکە، جا دەبینین کە لە خوارەوەی لاپەڕەکە هەمان ژمارەمان بۆ دروست دەبێت. ئنجا دەست دەکەین بە نووسینی ناوی نووسەرەکە و ناوی سەرچاوەی کتێبەکە یان نووسەرەکە یان چاپخانەکە .

## ٥- چـــۆنیّتی هیّنانـــی ویّـــنه بـــۆ نـــاو لاپـــەڕەکـــان

بـۆ هیّـنانی ویّـنەیەك بـۆ نـاو لاپـەڕەکانی بەرنامـەی وۆرد، دوو شیّوەمان هەیە بۆ هیّنانی ویّنە: ١- ویّنەی ناو بەرنامەکە کە بە Clip Art ناسـراوە. ٢- ویـنەی دیکـە کـە بـە ( مـن الملـف ) ناسراوە، کە لەم هەنگاوانە باسیان دەکەین .

١- سەرەتا ئەگەر ویستمان ویّنەیەك لە ناو Clip Art بیّنین، ئەوە دەچـینە سـەر شـریتی لیسـتەکان و لەویّشـەوە دەچـینە سەر لیستی ( أدراج )، ئـنجا دەچینە سەر فەرمانی ( صورە )، ئنجا یەك جار کلیکی لای چـەپی لـە سـەر دەکـەین، دەبینین شیّوەیەکمان بۆ دەردەچیّت کە هـەندیّك ویّنەی ئەفلام کارتۆنی تیّدایە. دەتوانین یەکیّك لەو ویّنانە هەڵـبژیّرین و یـەك جـار کلـیکی لای چەپ لە سەر فەرمانی Insert بکەین بۆ هیّنانی ویّنەکە بۆ ناو لاپەڕەکە .

٢-شـیّوەی دووەم کـە لـە ( ملـف )ـەوە دەبیّـت، هەمان کاری پیّشوو ئـە نجام دەدەیـن تـا دەگەینە سەر ( صورة )، ئنجا لەو لیستەی کە لە ( صورة ) دەردەچـیّت ( مـن الملف ) هەڵدەبژیّرین و یەك جار کلیکی لای چـەپی لـە سـەر دەکـەین، شـیّوەیەکی تـرمان بۆ دەردەکەویّ کە لەو شـیّوەیەدا، ویّـنەکان ئەگـەر لـە نـاو CD بـوو ئـەوە CDیەکـە هەڵدەبژیّـرین، یـان ئەگـەر لـە نـاو دیّسـك بـوو ئـەوە دیّسـکەکە هەڵدەبژیّـرین، یـان ئەگـەر لـە ناو بەشە هاردەکان بوو ئەوە بەشە هاردەکان هەڵدەبژیّرین . دوای ئەوە ویّنەکە دیاری دەکەین و کلیك لە سەر ( أدراج ) دەکەین بۆ هیّنانی ویّنەکە بۆ ناو لاپەڕەی بەرنامەکە.

## ٦-چۆنێتی هێنانی شێوەیەك بە ماوس ڕێك دەخرێت

بۆ هێنانی شێوەیەك کە بە ماوس ڕێك دەخرێت، مەبەستیش لە ڕێکخستن بە ماوس ئەوەیە کە ئەو شێوەیەی ئێستا باسی لێ دەکەین تەنها بە ئاڕاستەی ماوسەکە ڕێکی بخەین لە ناو لاپەڕەکە. بۆ ئەنجام دان و هێنانی ئەو جۆرە شێوانەش دەتوانین ئەم هەنگاوانە بە کار بێنین :

سەرەتا دەچینە سەر شریتی لیستەکان ئنجا لەوێوە دەچینە سەر لیستی ( أدراج ) و لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی ( صورة ) ، ئنجا لەوێوە چەند بەشێکی تری لێ دەبێتەوە، لەو بەشانەی تردا دەچینە سەر فەرمانی ( أشکال تلقائیة ) و یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت کە چەند نموونەیەکی تێدایە، هەر یەك لەو نموونانە چەند بەشێکن، ئێمە بە پێی پێویست کام لەو نمونانەمان بوێت ئەوە هەڵدەبژێرین، دواى هەڵبژاردنی نمونەکە و شێوەی وێنەکە یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین کە ئاڕاستەی ماوسەکە دەبێت بە شێوەی +، ئنجا دەچینە سەر لاپەڕەکە، لەوێ هەڵدەستین بە داگرتنی کلیکی لای چەپی ماوسەکە و ڕاکێشانی ماوسەکە بەو شێوەیەی کە خۆت مەبەستە، ئنجا دواى تەواو بوونی شێوەکە کلیکی لای چەپی ماوسەکە بەردەدەین، دەبینین ئەو وێنەیەمان لە سەر لاپەڕەکە بۆ دروست دەبێت و بەو شێوەیەی کە خۆت مەبەستت بوو .

# وانـــەی پێنجـــەم

١- چـۆنێتی هێنانی شێوەی نووسینێکی ئامادە کراو

٢- چـــۆنێتی هـێـنـانی چـوار گـۆشەیەکی نـووسین

٣- چـــۆنێتی گـۆڕینی شـێـوەی نـووسـینەکـان

٤- چـۆنێتی دانانی ژمارە یان نیشانە بۆ سەرە دێرەکان

٥- چـۆنێتی دانانی چوار چێوە بۆ نووسین یان لاپەڕە

٥- چۆنێتی دانانی نووسینەکان لەناو بەشێکی ستوونی

# ١- چۆنیتی هێنانی شێوەی نووسینێکی ئامادەکراو

بۆ هێنانی شێوەی نووسینێکی ئامادە کراو بۆ ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد دەتوانین ئەم چەند هەنگاوە بە کاربێنین .

ئەگەر ویستمان شێوەی نووسینێکی ئامادە کراو بێنین بۆ ناو لاپەڕەکە، کە ئەو شێوەیە لە ناو بەرنامەکە ئامادە کراوە، ئێمە تەنها دەستکاری نووسینەکە دەکەین و نووسینەکە دەگۆڕین بەو شێوەیەی کە خۆمان مەبەستمانە.. بۆ ئەنجام دانی ئەو کارە و هێنانی ئەو بەشە دەبێت سەرەتا بچینە سەر شریتی لیستەکان و لەوێ بچینە سەر لیستی ( أدراج )، ئنجا لەوێشەوە بچینە سەر فەرمانی ( صورة ) کە ئەو فەرمانە بەشی تری لێ دەبێتەوە. لە بەشەکانی ئەو فەرمانە دەچینە سەر Wordart ،ئنجا لەوێ یەك جار کلیکی لای چەپ دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا چەند نموونەی نووسینێك هەیە، ئێمە دەتوانین یەکێك لەو نمونانە هەڵبژێرین، ئنجا کلیکی لای چەپ لە سەر ( موافق ) دەکەین، شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەچێت کە نووسینی تێدایە، ئەو نووسینە دەسڕینەوە، ئنجا ئەو نووسینەی کە خۆمان دەمانەوێ لە شوێنی نووسینە کۆنەکە دەینووسین و کلیکی لای چەپ لە سەر ( موافق ) دەکەینەوە، دەبینین شێوەی ئەو نووسینە ئامادەکراوەی کە لە پێش دا هەبوو بۆمان هاتە ناو لاپەڕەکە و بەو شێوەیەی کە خۆمان نووسینمان تێدا نووسیبوو .

## ٢- چــۆنیێتی هــێــنــانی چــوارگــۆشەیەکی نــووسین

لـە نـاو بەرنامـەی وۆرد چوار گۆشـەی نووسین کـاری زۆر گـرنگی پـێ دەکـرێ.. بـۆ هێـنانی چوارگۆشـەیەکی نووسـین لـە نـاو لاپـەڕەکانی بەرنامـەی وۆرد دەتوانـین ئـەم چـەند هـەنگاوە بـە کاربێنین :

ئەگـەر ویسـتمان لـە بەشێکی لاپەڕەکە وێنەیەك دابنێین و لە بەشی بەرامـبەر وێنەکەدا نووسین بنووسین، ئەوە زۆر زەحمەتە ئەو نووسینە ئاسـاییە لـە بەرامـبەر وێـنەکەدا خـۆی ڕابگرێت، لە بەر ئەوەی ئەو وێـنەیە لـە شوێنێکی تـایبەت بە نووسین ڕاوەستاوە.. ئنجا بۆ ئەوەی بمانەوێـت ئـەو کـارە بـە سەرکەوتویی ئە نجام بدەین و نووسینێکی ئاسایی لە بەرامبەر وێنەیەك دا دابنێین، ئەوە دەبێت یەکێك لەو دوو بەشـە، یان نووسینەکە، یان وێنەکە، لە ناو چوارگۆشەیەکی نووسین دابنـێن، بـۆ ئـەو کـارەش دەبێـت بچـینە سـەر شـریتی لیستەکان و لەوێشەوە بچینە سەر لیستی ( أدراج )، لەوێشەوە بچینە سەر فەرمانی ( مـربع نص ) و یەك جار کلیکی لای چە پی لە سەر دەکەین، دەبینین کە شـێوەی ئاڕاسـتەی ماوسـەکە دەبێت بە شێوەی + ، ئنجا دەچینە سەر لاپەڕەکـە و کلیکی لای چەپ دادەگرین و ڕایدەکێشین بە بێ ئەوەی کە کلیکەکە بەر بدەین، تـا چوار گۆشەی نووسینەکەمان بۆ دروست دەبێت، ئنجا نووسینەکە لەناوی دەنووسین و لە بەرامبەر وێنەکەدا دایدەنێین.

## ٣- چـۆنێتی گۆڕینی شـێـوەی نـووسـیـنەكان

- بۆ گۆڕینی شێوەی ئەو نووسینانەی كە دەیان نووسین لە ناو لاپەڕەكانی بەرنامەی وۆرد، دەتوانین ئەم كارە بەم شێوەیەی لای خوارەوە و بە پێی ئەم هەنگاوانە ئەنجام بدەین .

ئەگـەر نووسـینێكمان نووسـی لە ناو لاپەڕەكانی بەرنامەی وۆرد دا و ویستمان شێوەی نووسینەكە لەو شێوەیەی كە لە سەرەتی بیگۆڕین بۆ شـێوەیەكی تر، دەبێت دوای ئەوەی كە نووسینەكە دەنووسین ئەو بەشە نووسـینە دیـاری بكەین، ئنجا دوای دیاری كردنەكە دەچینە سەر ئەو بۆشـاییەی كـە لـە سەر شریتی ( تەنسیق )دا هەیە، یەك یەك بە ناو ئـەو شـیوە نووسـینـانە دا دەگەڕێین تـا ئەو شێوەیە دەبینین كە خۆمان مەبەسـتمانە، ئـنجا یـەك جـار كلـیكی لای چـە پی لە سەر دەكەین، دەبینین ئەو نووسینەی كە نووسیومانە بەو شێوەیەی لێ دێ .

ڕێگـا یـەكی ترمان هەیە بۆ ئە نجام دانی ئەم كارە، كە ئەویشیان بە هـەمان شـێوە نووسـینەكان دەنووسـین، ئـنجا دوای تـەواو بـوون لە نووسـین، نووسـینەكە دیاری دەكەین، ئنجا یەك جار كلیكی لای ڕاست لـە سـەر نووسینە دیاری كراوەكە دەكەین، لیستێكمان بۆ دەردەچێت، لـەو لیسـتە دا دەچینە سەر فەرمانی ( خط ) و لەوێش یەك جار كلیكی لای چـە پی لـە سـەر دەكەین، دەبینین شێوەیەكمان بۆ دەردەچێت، كە دەتوانین لەو شێوەیەدا هەمان هەنگاوەكانی پێشوو ئە نجام بدەین.

Microsoft Word - کتاب وورد مع التعدیل

(( تەنسیق )) دا هەیە وە یەك یەك بە ناو ئەو شیوە نووسینانە دا دەگەرێین تا ئەو شێوەیە دەبینین کە خۆمان مەبەستمانە ئنجا یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین دەبینین ئەو نووسینەی کە نووسیومانە بەو شێوەیەی لێ دێ .

ڕێگایەکی ترمان هەیە بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە کە ئەویشیان بە هەمان شێوە نووسینەکان دەنووسین ئنجا دوای ئەوەی کە تەواو بوین لە نووسین نووسینەکە دیاری دەکەین ئنجا یەك جار کلیکی لای ڕاست دەکەین لە سەر نووسینە دیاری کراوەکە لیستێکمان بۆ دەردەچێت لەو لیستە دا دەچینە سەر فەرمانی (( خط )) ئنجا لەویش یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت کە دەتوانین لەو شێوەیەدا هەمان هەنگاوەکانی پێشوو بە کار بێنین.



# ٤- چۆنێتی دانانی ژماره یان نیشانه بۆ سەره دێڕەکان

دانانی ژماره یان نیشانه بۆ سەره دێڕەکان، ئەم کاره کارێکی زەروری نیه له ناو بەرنامەی وۆرد، بەلاّم له هەمان کاتدا له زۆر کاتدا پێویستیت پێی دەبێت و ئارەزووی ئەوه دەکەیت کە له پێش هەر دێڕێك نیشانەیەك یان ژمارەیەك دابنێی.. بۆ ئەنجام دانی ئەم کارەش دەتوانین به دوای ئەم هەنگاوانه دا بڕۆین .

ئەگەر ویستت له پێشەوەی ئەو چەند دێڕەی که نووسیوته نیشانه یان ژماره دابنێی، ئەوه دەتوانی ئەم کاره بەم شێوەیه ئەنجام بدەیت:
سەره تا ئەو چەند دێڕه دیاری دەکەین که دەمانەوێ نیشانه یان ژمارەی بۆ دابنێن، ئنجا دەچینه سەر شریتی لیستەکان و لەوێشەوه دەچینه سەر لیستی ( تنسیق )، له ناو لیستی ( تنسیق )دا دەچینه سەر فەرمانی ( تعداد نقطي و تعداد رقمي ) و یەك جار کلیکی لای چە پی له سەر دەکەین ، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەکەوێ که لەو شێوەیەدا دەتوانین نیشانه یان ژماره بۆ سەره دێڕەکان دابنێن، ئەگەر ویستمان نیشانه بێت ئەوه ( تعداد نقطي ) هەڵدەبژێرین و یەکێك لەو چەند نیشانەیەی کە تێیدایه هەڵی دەبژێرین و کلیك له سەر ( موافق ) دەکەین بۆ دانانی نیشانەکە.. ئەگەر ویستمان ژماره بێت ئەوه ( تعداد رقمي ) هەڵدەبژێرین و یەکێك لەو چەند ژمارەیەی که تێیدایه هەڵی دەبژێرین و کلیك له سەر ( موافق ) دەکەین بۆ دانانی ژمارەکه .

## ٥- چۆنێتی دانانی چوارچێوە بۆ نووسین یان لاپەڕە

لە ناو بەرنامەی وۆرد تایبەتمەندیەك هەیە كە ئەویش تایبەتە بە دانانی چوارچێوە، ئنجا ئەو چوارچێوەیە چ بۆ نووسین بێت، یاخۆد بۆ لاپەڕەكە.. بۆ ئەنجام دانی ئەم كارەش وەكو كارەكانی پێشوو دەچینە سەر باسی ئەم هەنگاوانەی لای خوارەوە .

ئەگەر ویستمان چوار چێوەیەك تەنها بۆ نووسینەكە دابنێین، ئەوە نووسینێك دەنووسین، بۆ نمونە نووسینێك بنووسە، ئنجا ئەو نووسینە دیاری بكە، دوای ئەوە بچۆرە سەر شریتی لیستەكان، ئنجا بچۆرە سەر لیستی ( تنسيق ) و لەوێشەوە بچۆرە سەر فەرمانی ( حدود و تظليل )، یەك جار كلیكی لای چەپی لە سەر بكە، دەبینین كە شێوەیەكمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا، لە بەشی ( حدود ) دەتوانین تەنها چوار چێوەیەك بۆ نووسینەكە دابنێین، ئەویش بە هەڵبژاردنی یەكێك لەو چوار چێوانەی كە لە بۆشاییەكە دا هەیە .

بۆ دانانی چوار چێوە بۆ لاپەڕەكە دەتوانین هەمان كارەكانی پێشوو ئەنجام بدەین تا دەگەینە سەر فەرمانی ( حدود و تظليل ) و دوای كلیك كردن لە سەر ئەم بەشە دەچینە سەر ( حد الصفحة ) و لەوێ یەك جار كلیكی لای چەپی لە سەر دەكەین، دەبینین كە شێوەی پێشوومان بۆ دەگۆڕێ و دەبێتە شێوەیەكی تر، ئنجا بە هەمان شێوە لە بۆشاییەكاندا چوار چێوەیەك هەڵدەبژێرین و كلیكی لای چەپ لە سەر ( موافق ) دەكەین بۆ دانانی چوار چێوەكە .

## ٦- چۆنێتی دانانی نووسینەکان لە ناو بەشێکی ستوونی

بۆ دانانی نووسینەکان لە ناو چەند بەشێکی ستوونی، دەتوانین ئەم کارەش بە شێوەیەکی ئاسان ئەنجام بدەین، ئەگەر ڕەچاوی ئەم چەند هەنگاوە بکەیت .

سەرەتا نووسینێکی زۆر بنووسە، ئەو نووسینە زۆرە دیاری بکە، بۆ ئەوەی بتوانی وەکو شێوەی شیعر ئەو نووسینانە لە ناو چەند بەشێکی ستوونی یان ( عمودی ) دابنێی، ئەوە بچۆرە سەر شریتی لیستەکان و لەوێشەوە بچۆرە سەر لیستی ( تنسیق )، ئنجا لە ناو لیستی تنسیق بچۆرە سەر فەرمانی ( أعمدة ) و یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر بکە، دەبینین کە شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا چەند نمونەیەکت لە پێش چاودا هەیە، دەتوانی هەر کام لەو نمونانە هەڵبژێری، دوای هەڵبژاردنی نمونەکە یەك جار کلیکی لای چەپ لە سەر فەرمانی ( موافق ) بکە تا نووسینەکانت لە یەك بەشەوە بۆ بکات بەو چەند بەشەی کە خۆت هەڵت بژاردووە .

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە ڕێگایەکی تریشمان هەیە، کە ئەویش ڕێگایەکی ئاسانە.. دوای دیاری کردنی نووسینەکانت بچۆرە سەر شریتی قیاسی، کە ئەو شریتە دەکەوێتە ژێرەوەی شریتی لیستەکان، ئنجا لەوێ ئەم شێوەیەت ☰ لە پێش دا هەیە، یەك جار کلیکی لە سەر بکە، چەند بەشێکی ستوونیت بۆ دەر دەچێت، ئەگەر ویستت نووسینەکان لە ناو چەند بەش دابنێ ئەوە ئەوەندە بەشە ستوونی یە هەڵبژێرە و کلیکی لای چەپی لە سەر بکە بۆ دانانی نووسینەکان لە ناو چەند بەشێکی ستوونی .

# وانـــەی شەشەم

١- چۆنێتی ناردنی نووسینێك بۆ وردبینی ڕێنووسی.

٢- چـۆنێتی نـاردنی نـووسینێك بـۆ فـەرهـەنگـۆك.

٣- چۆنێتی زانینی ژمارەی پیت و ووشە و دێر و لاپەڕەکان.

٤- چــــۆنێتـی کــــورت کــــردنــــەوەی دێـــرێــك.

٥- چـۆنـێـتی پـاراســتنی نـووســـینەکە لـە ســڕینەوە.

٦-چـۆنێتی گـۆڕینی بەرنامەکە لە عەرەبی‌یەوە بۆ ئینگلیزی.

## ١ - چۆنیێتی ناردنی نووسینێك بۆ وردبینی ڕێنووسی

بۆ ناردنی ئەو نووسینانەی کە بە زمانی (عەربی) و (ئینگلیزی) دەنووسرێن لە ناو بەرنامەی وۆرد دا بۆ بەشی وردبینی ڕێنووسیی، ئەوە دەتوانین ئەم کارە بەم شێوانە ئەنجام بدەین :

ئەگەر نووسینێکی (عەرەبی) یان (ئینگلیزی)مان نووسی و بینیمان لە ژێرەوەی ئەو نووسینە دا خەتێکی بچوکی سور هەیە، ئەوە بە مانای ئەوە دێت کە ئەو نووسینە لە ڕوانگەی ڕێنووسیەوە هەڵەیە. بۆیە ئەگەر ویستمان ئەو هەڵەیە چاك بکەینەوە، ئەوە دەتوانین سەرەتا ئەو نووسینانە دیاری بکەین، ئنجا بچینە سەر شریتی لیستەکان ولەوێوە بچینە سەر لیستی (أدوات)، ئنجا بچینە سەر فەرمانی (تدقيق أملائي و تدقيق نحوي) و لەوێ یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین کە شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا بۆشاییەکمان لێ دیار دەبێ کە نووسینەکانی تێدا دیارە و ئەو نووسینانە هەندێکیان بە ڕەنگی سوور نووسراوە، لە ژێرەوەی بۆشایی نووسینەکە بۆشاییەکی تر دەبینین، کە ئەویشیان ووشە ڕاستەکانی تێدایە. ئێمە دەتوانین لە بۆشایی ووشە ڕاستەکاندا ووشە گونجاو هەڵبژێرین و دوو جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین ووشە هەڵەکەمان بۆ دەگۆڕێ بە ووشە ڕاستەکە، ئیتر بەو شێوەیە لەگەڵی دادەڕۆین تا کۆتایی نووسینەکان.

تێبینی: لە نووسینی کوردیدا لە ژێرەوەی هەموو نووسینەکاندا خەتێکی سوور پەیدا دەبێ بەڵام ئەوە مانای وا نیە کە ئەو نووسینانە هەڵەن، بەڵکو مانای ئەوەیە کە ئەو بەرنامەیە ڕێنووسی زمانی کوردی تێدا نیە.

## ٢- چۆنیتی ناردنی نووسینێك بۆ فەرهەنگۆك

بۆ ناردنی بەشە نووسینێك بۆ فەرهەنگۆك ( قاموس ) لە ناو لاپەڕەكانی بەرنامەی وۆرد دا، دەتوانین ئەم كارە بە شێوەیەكی ئاسان ئەنجام بدەین، بەڵام ئەوەی كە شایانی باسە ئەم بەشە تەنها یەك یەك ووشەكانمان بۆ وەردەگێڕێ .

بۆ ناردنی نووسین بۆ فەرهەنگۆك، دەبێت نووسینێكی ( عەرەبی ) یان ( ئینگلیزی ) بنووسین، ئنجا ئەو بەشە نووسینە دیاری دەكەین، مەبەستیش لەو بەشە نووسینە ئەوەیە كە دەبێت تەنها یەك ووشە دیاری بكەین، ئنجا دوای دیاری كردنەكە دەچینە سەر شریتی لیستەكان، لەوێشەوە دەچینە سەر لیستی ( أدوات )، ئنجا لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی ( اللغە ) كە ئەو فەرمانە چەند بەشێكی لێ دەبێتەوە، لەو چەند بەشە ئێمە دەچینە سەر فەرمانی ( القاموس ) و یەك جار كلیكی لای چەپی لە سەر دەكەین، دەبینین شێوەیەكمان بۆ دەردەچێت كە ئەو شێوەیە پێك هاتووە لە دوو بەش، لەو بەشەی یەكەم ناوی ووشەكە دەنووسی وە لە بەشی دووەم دا ئەو بەشە خۆی هەڵدەستێ بە پێدانی ماناى ووشەكەی كە تۆ نووسیوتە، ئنجا دوای ئەوەی كە ماناكەی نووسی، دەتوانی ئەو ووشەیەی خۆت بەو ووشەیەی ئەو بگۆڕی، ئەویش بە هۆی فەرمانی ( أستبدال ). بەو شێوەیە دەتوانی ووشە بە ووشە نووسینەكانت لە عەرەبییەوە بگۆڕی بۆ ( ئینگلیزی ) و بە پێچەوانەشەوە لە ( ئینگلیزی )یەوە بۆ عەرەبی .

## ٣-چۆنیێتی زانینی ژمارەی پیت و وشە و دێر و لاپەڕەکان

بۆ زانینی ژمارەی پیت و وشە و دێر و لاپەڕە لە ناو بەرنامەی وۆرد، دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین، کە لە زۆر کاتدا پێویستمان بەوە دەبێت .

ئەگەر ویستمان لە ناو بەرنامەی وۆرد ئەنجامی ئەو کارەی کە کردومانە بیزانین و، بزانین ژمارەی پیت و وشە و دێر و لاپەڕەکانی ئەو نووسینانەی کە نووسیومانە چەندن، دەبێت سەرەتا نووسینێکە دیاری بکەین، دوای دیاری کردنەکە بچۆرە سەر شریتی لیستەکان و، لەوێشەوە بچۆرە سەر لیستی ( أدوات )، لەوێشەوە بچۆرە سەر فەرمانی ( عدد الکلمات )، ئنجا لەویٚ یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر بکە. دەبینین کە چوارگۆشەیەکمان بۆ دەردەکەویٚ، ئەو چوارگۆشەیە هەندێك نووسینی تێدایە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە چەند پیت و وشە و دێر و لاپەڕەن. بەو شێوەیە دەزانین کە ئەنجامی کارەکانمان چەند و چۆن بووە .

تێبینی : ئەم کارە دەوەستێتە سەر ئەوەی کە چەند نووسین دیاری بکەی، ژمارەی ئەوەندە نووسینەت پیٚ دەڵێت، واتا ئەگەر هەموو نووسینەکان دیاری بکەی، ژمارەی هەموو نوسینەکانت پیٚ دەڵێت، ئەگەر بەشێکی کەم دیاری بکەی، ئەوە هەر ژمارەی ئەو بەشە کەمەت بۆ دەردەخات .

# ٤- چۆنێتی کورت کردنەوەی دێرێک

کورت کردنەوەی دێرێك لە ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد، ئەم بەشە بە بەشە گرنگەکانی بەرنامەی وۆرد دەژمێردرێت، کە ئەم بەشەش بەم شێوەیەی لای خوارەوە دەتوانین ئەنجامی بدەین:

ئەگەر نووسینێك زۆر بە کارمان هێنا لە ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد و، ویستمان ئەو نووسینە یان ئەو دێرە کورت بکەینەوە تا بتوانین بە هۆی یەك پیت و کلیلی (سپەیس)ـەوە بە کاریان بێنین.. بۆ ئە نجام دانی ئەو کورت کردنەوەیە دەبێت بچینە سەر شریتی لیستەکان و لەوێشەوە بچینە سەر لیستی (أدوات)، ئنجا لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی (أختصار) و، لەوێ یەك جار کلیکی لای چە پی لە سەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا دوو بۆشایی تێدایە، لە بۆشایی یەکەم ، یەکەم پیتی ئەو دێرە دەنووسین، لە بۆشایی دووەمیش دێرەکە بە تەواوی دەنووسین، ئنجا دەچینە سەر فەرمانی (اضافة) و یەك جار کلیکی لای چە پی لە سەر دەکەین، ئنجا دیسان کلیکی لای چەپ لە سەر (موافق) دەکەین بۆ ئە نجامدانی کورت کردنەوەکە، ئنجا دەچینە ناو لا پەڕەکە و لەوێ ئەو یەکەم پیتەی کە لە بۆشایی یەکەمی شێوەکەدا نووسیبومان لە ناو لا پەڕەکە دەینووسین و کلیلی (سپەیس) دادەگرین، دەبینین دێرەکەمان بۆ تەواو دەکات، بەو شێوەیە لە هەر شوێنێك ویستمان ئەو دێرە بە کار دێنین .

## ٥- چۆنیـتی پاراستنی نووسینەکە لـە سڕینەوە

بۆ پاراستنی ئەو نووسینانەی کە لـە ناو لاپـەڕەکانی بەرنامـەی وۆرد دەینووسین، دەتوانین کارێکی وا بکەین کە ئەو نووسینانە دەست کاری نەکرین و نەسڕێنەوە.. بۆ ئەنجام دانی ئەم کارەش بە دوای ئەم چەند هەنگاوە دا بڕۆ :

سـەرەتا دەبێت هەندێك نووسین بنووسین بۆ ئەوەی بتوانین ئەم کارەی لـە سـەر ئە نجام بدەین، دوای ئەوەی نووسینەکەمان نووسی، دەچینە سـەر شـریتی لیسـتەکان و لەوێشـەوە دەچـینە سەر لیستی ( أدوات )، لەوێشـەوە دەچـینە سـەر فەرمانی ( حماية المستند ) و لەوێ یەك جار کلیکی لای چەپ لە سەر ئەو فەرمانە دەکەین، دەبینین کە شێوەیەکمان بـۆ دەردەچـیت، لـەو شـێوەیەدا بۆشـاییەك هەیە، ئێمە دەتوانین بۆ پاراسـتنی نووسـینەکان لـە دەسـت کـاری و سڕینەوە، لەو بۆشایەدا ژمارەیـەکی نهێـنی یـان ناوێکی نهێنی بنووسین، ئنجا دوای نووسینی ژمـارە نهینـیەکە یەك جار کلیکی لای چەپ لە سەر ( موافق ) دەکەین، دەبینین بۆشاییەکی ترمان بۆ دەردەچێت، هەمان ژمارە نهێنییەکە یان ناوە نهێنیەکە لە بۆشایی دووەمدا دەنووسینەوە و یەك جار کلیکی لای چـەپ لە سەر ( موافق ) دەکەینەوە بۆ ئە نجام دانی پاراستنەکە.. ئیتر بـەو شـێوەیە دەبیـنین ئەگەر هەوڵ بدەین نووسینەکە بسڕینەوە یان دەسـتکاری بکـەین، ئـەوە نـاتوانین تـا بـە هـەمان شـێوەی پێشوو نەچـینەوە هـەمان جیگا کە ( الغاء حماية المستند )ـە و لەوێوە ژمارە یان ناوە نهێنیەکە لا نەدەین .

## ٦- چـۆنێتی گـۆڕینی بەرنامەکە لە عەرەبی‌یەوە بۆ ئینگیزی

بـۆ گۆڕیـنی روبـەری لاپـەڕەی بەرنامـەی وۆرد کـە مەبەسـت لـە (شـریتی لیسـتەکان و فەرمانـەکانی نـاو شـریتەکانە) لـە زمـانی عەرەبیەوە بۆ زمانی ئینگلیزی، ئەوە دەتوانی بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە بە دوای ئەم هەنگاوانەدا بڕۆی .

| ئەگەر ویستمان روبەری بەرنامەی وۆرد لە زمانی عەرەبی‌یەوە بگۆڕین بـۆ زمـانی ئینگلـیزی، یان بە پێچەوانەوە، ئەوە دەچینە سەر شریتی لیسـتەکان و لـەوێوە دەچینە سەر لیستی ( أدوات )، لەوێشەوە دەچینە سـەر فـەرمانی ( خـیارات ) و یـەك جـار کلـیکی لای چـە پی لە سەر دەکـەین، دەبیـنین شـێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا کۆمەڵی کـرداری تـێدایە.. ئـەوەی ئـێمە ئیشـمان پێی هەیە و بۆ ئەم بەشە بـەکاری دێـنین فـەرمانی ( عـربي )یە، یەك کلیکی لای چە پی لەسەر دەکـەین، دەبینین فەرمانەکانی تـایبەت بەم بەشەمان بۆ دەردەکەوێ، جـا دەچینە سەر بەشی ( لغـة واجهة التطبيق )، ئنجا ئەو بەشە ئەگەر عـەرەبی بـوو ئـەوە دەیکەین بە ئینگلیزی، ئەگەر ئینگلیزی بوو ئەوە دەیکـەین بـە عـەرەبی، دوای ئـەوە یەك جار کلیکی لای چەپ لەسەر ( موافـق ) دەکەین بۆ ئە نجام دانی ئەم کارە و گۆڕینی ڕوبەری لا پەڕەی بەرنامەکە . |
|---|

# وانەی حەوتەم

١- چـۆنێتی هـێنانی خشتە بـۆ نـاو بـەرنامەکـە

٢- چـۆنێتی رێکخستنی خشتەکە لە ناو بەرنامەکە

٣- چۆنێتی زیاد کردنی ڕیـــز یان ستـــون بۆ خشتەکە

٤- چۆنێتی سڕینەوەی ڕیـــز یان ستـــون بۆ خشتەکە

٥- چۆنێتی دیاری کردن و سڕینەوەی خشتەکە لەناو لاپەڕە

## ١- چـــۆنێتی هـــێنانی خشته بـۆ نـاو بـەرنامەکـە

بۆ هێنانی خشتە(جدول)ێك بۆ ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد و کار کردن لە سەر ئەو خشتەیە، دە توانین بەم شێوەیەی لای خوارەوە ئەو کارە ئەنجام بدە ین :

ئەگـەر ویسـتمان خشـتە( جـدول )ێـك بێنیـنە نـاو لا پەڕەیـەك لـە لا پـەڕەکانی بەرنامـەی وۆرد و کـاری لـە سەر بکەین، سەرەتا دەبێت بچـینە سـەر شریتی لیستەکان، لەوێوە دەچینە سەر لیستی ( جدول )، لەوێشـەوە دەچـینە سـەر فـەرمانی ( أدراج جـدول )، لەوێ یەك جار کلـیکی لای چـەپ دەکـەین، دەبیـنین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شـێوەیەدا سـێ بۆشـایی دەبیـنین، بۆشـایی یەکـەم ژمـارەی خشـتە سـتوونیەکانی لێ دیـاری دەکـەین، لە بۆشایی دووەمدا ژمارەی خشتە ئاسـۆییەکانی لێ دیاری دەکەین، لە بۆشایی سێیەمدا پانی و بەرینی خشتە ستونیەکان و خشتە ئاسۆییەکانی لێ دیاری دەکەین، ئنجا دوای دیـاری کـردنی ئەم بەشانە یەك جار کلیکی لای چەپ لە سەر ( موافق ) دەکـەین، دەبیـنین ئـەو خشتەیەی هەڵمان بژاردبوو بۆمان هاتە ناو لا پەڕەی بەرنامەکە .

## ٢- چـۆنێتی ڕێکخستنی خشتەکە لە ناو بەرنامەکە

بۆ ڕێکخستنی ئەو خشتەیەی کە لە بەشی ڕابردودا باسمان لێ کرد ئێستا لەم بەشەدا باسی ڕێکخستنی ئەو خشتەیە دەکەین بەم چەند هەنگاوەی لای خوارەوە .

ئەگـەر ویسـتمان ئـەو خشتەیەی کە لە ناو لاپەڕەکانی بەرنامەکەدا هـەن ڕێکـیان بخـەین، ئەوە بە ئاڕاستەی ماوسەکە دەچینە سەر ئەو بەشـە خشـتەیەی دەمانەوێ ڕێکی بخەین، لەوێدا ئاڕاستەکە لە سەر ئـەو بەشە ڕادەگرین تا دەبینین کە شێوەی ئاڕاستەکە دەبێت بە هێمای + ، ئـنجا دوای ئـەوەی کـە ئاڕاستەی هێماکە بوو بەو شێوەیە، یەك جـار کلـیکی لای چـەپ لـە سـەر لایەکی خشتەکە دەکەین و کلیکەکە بـەرنادەین، ئـنجا هەڵدەسـتین بە ڕاکێشانی ئاڕاستەی ماوسەکە بەو ئاڕاسـتەیەی کـە خۆمـان مەبەسـتمانە، کـە گەیشتینە ئەو شوێنەی دەمانـەوێ خشـتەکەی لـێ دابنێین، ئاڕاستەی ماوسەکە بەر دەدەین، دەبیـنین شێوەی خشتەکە لە سەر شێوەکەی جارانی نەما وە و بووە بەو شێوەیەی کە خۆت ئە نجامت دا .

تێبیـنی: دەتوانـی ئەم شێوەیە بۆ هەردوو لای خشتەکە بە کار بێنی، واتا بۆ ستوونی و بۆ ئاسۆیی .

## ٣- چۆنێتی زیاد کردنی ڕیـــز یان ستـــون بۆ خشتەکە

بـۆ زیـاد کـردنی ڕیـزێك یـان سـتوونێك بـۆ نـاو خشـتەکە، دەتوانـین ئـەم کـارەش وەکـو کارەکـانی ڕابـردوو بـە ئاسـانی ئەنجام بدەین، بە پێی ئەم هەنگاوانەی لای خوارەوە :

ئەگەر ویستمان ڕیزێك یان ستوونێك بۆ ناو خشتەکە زیاد بکەین، لە نـاو لا پـەڕەکانی بەرنامەی وۆرد، ئەوە دەبێت بە ئاڕاستەی ماوسەکە بچـینە سـەر ئەو بەشە خشتەیەی کە دەمانەوێ بەشێکی تری بۆ زیاد بکـەین، ئـنجا لـە سەر ئەو بەشە یەك جار کلیکی لای ڕاست دەکەین، دەبینین ئەو بەشە ڕەش دەبێت و لیستێکمان بۆ دەردەچێ، لەو لیستەدا دەچـینە سەر فەرمانی ( أدراج عمود ) بۆ زیاد کردنی بەشە خشتەیەکی سـتوونی، بـۆ زیـاد کردنی بەشە خشتەیەکی ئاسۆیی لە هەمان لیست کلیك لە سەر ( أدراج صفوف ) دەکەین.. بەو شێوەیە دەتوانین ئەم کارە ئە نجام بدەین .

ڕێگایـەکی ترمان هەیە بۆ ئە نجام دانی هەمان کار، واتـا زیاد کردنی ڕیز یان دێر، کە ئەویشیان ئەوەیە بەشە خشتەکە دیاری دەکەین، کە بینیمان بەشە خشتەکە ڕەش بوو، ئنجا دەچینە سەر لیستی ( جدول ) و لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی ( أدراج عمود ) یان ( أدراج صفوف ) .

## ٤- چۆنیێتی سڕینەوەی ڕیـــز یان ستـــون بۆ خشتەکە

بۆ سڕینەوەی ڕیزێك یان ستوونێك لە ناو خشتەکە، دەتوانین بە هەمان شێوەی پێشوو، چۆن زیاد کردنەکەمان ئەنجام دا، بە هەمان شێوە دەشتوانین ئەگەر لێمان زیاد بوو ئەوە لێی کەم بکەینەوە و بیسڕینەوە، بە پێی ئەم هەنگاوانەی لای خوارەوە .

ئەگــەر ویستمان ڕیزێك یان ستوونێك لە ناو خشتەکە کەم بکەینەوە لــە نــاو لا پــەڕەکانی بەرنامــەی وۆرد، دەبێت بە ئاڕاستەی ماوسەکە بچــینە ســەر ئــەو بەشــە خشــتەیەی کــە دەمانــەوێ بەشێکی لێ کەم بکەیــنەوە، ئنجا لەوێ یەك جار کلیکی لای ڕاست دەکەین لە سەر ئەو بەشــە، دەبینین ئەو بەشە ڕەش دەبێت و لیستێکمان بۆ دەردەچێ، لەو لیســتەدا دەچــینە سەر فەرمانی ( حذف عمود ) بۆ کەم کردنەوەی بەشە خشتەیەکی ستوونی ، بۆ کەم کردنەوەی بەشە خشتەیەکی ئاسویی لە هــەمان لیســت کلــیك لــە سەر ( حــذف صفوف ) دەکەین.. بەو شێوەیە دەتوانــین ئــەم کــارە ئــە نجام بدەیــن بــۆ سڕینەوە و کەم کردنەوەی بەشێکی زیاد .

ڕێگایــەکی ترمان هەیە بۆ ئە نجام دانی هەمان کار، واتا کەم کردنی ڕیز یان دێر، کە ئەویشیان ئەوەیە بەشە خشتەکە دیاری دەکەین، کە بینیمان بەشە خشتەکە ڕەش بوو، ئنجا دەچینە سەر لیستی ( جدول ) و لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی ( حذف عمود ) یان ( حذف صفوف ) .

## ٥ - چۆنێتی دیاری کردن و سڕینەوەی خشتەکە لە ناو لاپەڕە

بۆ دیاری کردنی ئەو خشتەیەی کە لەناو لاپەڕەیەك لە لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد دایە، گەر بمانەوێ دیاری بکەین، نابێ وەکو نووسینێکی ئاسایی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، بەڵکو دەبێ لە دەرەوەی خشتەکەوە دیاری کردنەکە ئەنجام بدرێ، بەڵام بۆ سڕینەوەکە دەتوانین مامەڵەیەکی ئاسایی لە گەڵدا بکەین و وەکو نووسین بیسڕینەوە.. بڕوانە ئەم هەنگاوانە .

| دوای ئەوەی ئیشمان بە خشتەکە نەما، لە ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد، دەچینە سەر بەشێك لە دەرەوەی خشتەکە و بە ئاراستەی ماوسەکە کلیکی لای چەپ دەکەین، ئنجا بێ ئەوەی کلیکەکە بەربدەین ئاراستەی ماوسەکە ڕادەکێشین بەو شێوەیەی کە خشتەکەمان بۆ دیاری دەکات لە دەرەوە، کە زانیمان ئاراستەی ماوسەکە گەیشتە ئەو ئاستەی کە تەواو خشتەکە دیاری دەکات، ئاراستەکە بەر دەدەین. دەبینین خشتەکە بە گشتی دیاری دەبێ، بۆ سڕینەوەی خشتەکەش لەناو لاپەڕەکە، دەچینە سەر لیستی ( تحرير ) و فەرمانی ( مسح ) هەڵدەبژێرین، یان لە سەر کیبۆردەکە کلیلی ( Delete ) هەڵدەبژێرین بۆ سڕینەوەی ئەو خشتەیەی لە ناو لاپەڕەی بەرنامەکە کە دیاری کراوە. |
| --- |

# ئەو کلیلە گرنگانەی کە وشە کوردیەکانی پێ دەنووسرێ لە سەر کیبۆرد

بۆ ناسینی ئەو کلیلانەی ووشە کوردیەکانی پێ دەنووسرێ، بڕوانە ئەم بەشانە.

١- پیتی ( ڤ ) ی کوردی بە هۆی ئەم کلیلەوە ( ظ / ؟ ) دەنوسرێ دوای ئەوەی کە شێوەی خەتەکە دەگۆڕی بە خەتێکی کوردی.

٢- پیتی ( گ ) ی کوردی بە هۆی ئەم کلیلەوە ( ط " ) دەنوسرێ دوای ئەوەی کە شێوەی خەتەکە دەگۆڕی بە خەتێکی کوردی .

٣- پیتی ( پ ) ی کوردی بە هۆی ئەم کلیلەوە ( ث E ) دەنوسرێ دوای ئەوەی کە شێوەی خەتەکە دەگۆڕی بە خەتێکی کوردی .

٤- پیتی ( چ ) ی کوردی بە هۆی ئەم کلیلەوە ( ض Q ) دەنوسرێ دوای ئەوەی کە شێوەی خەتەکە دەگۆڕی بە خەتێکی کوردی .

٥- پیتی ( ژ ) ی کوردی بە هۆی ئەم کلیلەوە ( ذ ~ ) دەنوسرێ دوای ئەوەی کە شێوەی خەتەکە دەگۆڕی بە خەتێکی کوردی .

٦- ئەم شێوەیەش ( ˇ ) لە سەر پیتەکان بە هۆی ئەم دوو کلیلەوە دروست دەبێت کلیلی ( Shift ) + ( ض Q ) دوای ئەوەی کە شێوەی خەتەکە دەگۆڕی بە خەتێکی کوردی .

٧- ئەم شێوەیەش ( ˇ ) لە ژێر پیتەکان بە هۆی ئەم دوو کلیلەوە دروست دەبێت کلیلی ( Shift ) + ( ش A ) دوای ئەوەی کە شێوەی خەتەکە دەگۆڕی بە خەتێکی کوردی .

# ناسینی کلیلی فەرمانەکان

## (( ئەو فەرمانانەی کە بە کیبۆرد ئەنجام دەدرێن ))

بۆ ناسینی ئەو فەرمانانەی کە بە کیبۆردەکە ئە نجام دەدرێن بڕوانە ئەم چەند فەرمانە

١- ( Ctrl + Z ) واتا گەڕانەوە لە کاری پێشوو .

٢- ( Ctrl + X ) واتا بڕینی نووسین یان بەشێك .

٣- ( Ctrl + C ) واتا لە بەر گرتنەوەی نووسین یان بەشێك .

٤- ( Ctrl + V ) واتا دانانی نووسین یان بەشێك .

٥- ( Ctrl + N ) واتا هێنانی لاپەڕەیەکی تازە .

٦- ( Ctrl + A ) واتا دیاری کردنی نووسینەکە .

٧- ( Ctrl + S ) واتا پاراستنی لاپەڕە .

٨- ( Ctrl + F ) واتا گەڕان بە دوای نووسین .

٩- ( Ctrl + H ) واتا گۆڕینی ووشە بە ووشەیەکی تر.

١٠- ( Ctrl + G ) واتا چوونە سەر لاپەڕە یان دێڕ .

١١- ( Ctrl + J ) واتا ڕێکخستنی نووسینەکان لە یەك ئاست.

١٢- ( Ctrl + L ) واتا بردنی نووسینەکان بۆ لای چەپ.

١٣- ( Ctrl + Q ) واتا بردنی نووسینەکان بۆ لای ڕاست.

١٤- ( Ctrl + E ) واتا بردنی نووسینەکان بۆ ناوەڕاستی لاپەڕە .

١٥- ( Ctrl + Y ) واتا دووبارە دانانەوەی نووسینێك.

١٦- ( Ctrl + U ) واتا دانانی خەتێك لە ژێر نووسین .

١٧- ( Ctrl + I ) واتا لارکردنەوەی نووسین ( مائل ) .

١٨- ( Ctrl + O ) واتا کردنەوەی بەشێکی پارێزراو .

١٩- ( Ctrl + P ) واتا فەرمانی چاپ کردن .

٢٠- ( Ctrl + w ) واتا داخستنی لاپەڕەکە .

٢١- ( Alt + f 4 ) واتــا داخــستــنى بــەرنـــامــە .

٢٢- ( م + Alt ) بۆ كردنەوەى ليستى ( ملف ) لــە ناو وۆرد.

٢٣- ( ح + Alt ) بۆ كردنەوەى ليستى ( تحرير ) لە ناو وۆرد.

٢٤- ( ع + Alt ) بۆ كردنەوەى ليستى (عرض) لە نـــاو وۆرد.

٢٥- ( ر + Alt ) بۆ كردنەوەى ليستى ( ادراج ) لــە نــاو وۆرد.

٢٦- (س + Alt ) بۆ كردنەوەى ليستى (تنسيق) لە نــاو وۆرد.

٢٧- (د + Alt ) بۆ كردنەوەى ليستى (ادوات) لــە نـــاو وۆرد.

٢٨- (ج+ Alt ) بۆ كردنەوەى ليستى ( جدول ) لــە نــاو وۆرد.

٢٩- (ط+ Alt ) بۆ كردنەوەى ليستى (اطار) لـــە نــاو وۆرد.

٣٠- (ت+ Alt ) بــۆ كردنەوەى ليستى (تعليمات) لە ناو وۆرد.

٣١- ( Ctrl + Shif ) لاى ڕاست واتـا نووسين بە ئاراستەى ( عربى ).

٣٢- ( Ctrl + Shift ) لاى چەپ واتـا نووسين بە ئاراستەى (ئينگليزى)

٣٣- ( د + Ctrl ) گەورە كردنى نووسين لە ناو بەرنامەى وۆرد.

٣٤- ( ج + Ctrl ) بچوك كردنى نووسين لە ناو بەرنامەى وۆرد.